# ڕوونکردنەوەی قوڕئانی

## بۆ ئایەتەکانی حوکمڕانی

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ

نووســـینی
التوحيدی

# ڕوونکردنەوەی قورئانی بۆ ئایەتەکانی حوکمڕانی

﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾

﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴾

## نوسینی : التوحیدی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إنَّ الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أنَّ محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾[1] .

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً ، وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَتَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾[2] .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً ﴾[3] .

أما بعد :

فإنَّ أصدقَ الحديثِ كلام الله ، وخيرَ الهدي هدي محمد ( ﷺ ) ، وشرَّ الأمور محدثاتها ، وكلَّ محدثةٍ بدعة ، وكل بدعةٍ ضلالة ، وكلَّ ضلالةٍ في النار .

به ريزان به پێويستم زانى له سه ر ئه م سێ ئايه ته چه ند رونكردنه وه يك بده م كه ئيستا مسولمانيكى زۆرى به ره و لايكى تر بردوون و له سه رسه ر ليشيوياييكى رووندان چونكه خۆشه ويستيان بۆ كه سيك هه يه كه دژى ئيسلام و مسولمانانن يارمه تيان ده ده ن و هتد.... ئه ويش ئه م سێ ئايه ته يه ئايه تى يه كه م دياره و روونه به لام له دوو ئايه ته كه ى تر ته ئويليكى ساردى بۆ ده كه ن و بێ ئه وه ى بگه رينه وه بۆ سه رچاوه كه ى كه قورئانه به تايبه ت مه دخه ليه كان هه ركاتيك باسى ئه وه بكه يت كه هه ركه سيك حوكم نه كات به قورئان كافر ده بيت يه كسه ر ده ليت كاكه ئه ى خوايي گه وره به الظَّالِمُونَ و الْفَاسِقُونَ ش دايي ناون وه منيش مه به ستى سه ره كيم

---

(١) سورة آل عمران : ١٠٢.

(٢) سورة النساء : ١.

(٣) سورة الأحزاب : ٧١.

ئه وه یه كه هه ر كه سیك حوكم نه كات به قورئان ئه وه كافر ده بیت با به زمانیش بلیت مسولمانم وه لیره شدا باسی حوكم نه كردن به قورئان نا كه م چونكه به كتێب و به وتار ئه م باسه روون كراوه ته وه وبڕاوه ته وه به لام هیشتا لایی هه ندیك مسولمان بابه ته كه به ته واوی روون نیه لایان چونكه مه دخه لیه كان به شیوه یك خۆیان ناساندووه كه له قورئان و فه رمووده لاناده ن وپابه ندن پێیه وه جا من ته نها باسی ئه م سێ ئایه ته ده كه م له م سێ یانه ش دوانیان چونكه ئایه تی یه كه م روونه ان شاءالله ده ست ده كه ین به گه رانیك به نێوقورئانداو بزانین خوایي گه وره ووشه ی ظلم وفسق ی بۆ چ كه سیكی یان بۆچ كۆمه له یكیش به كار هیناوه .

ئه مانه سێ ئایه ته كه ن

١- ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾

٢- ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾

٣- ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴾

ئایه تی یه كه م وادیاره و خوایي گه وره به كافر ناوی بردوون

ئینجا بابینه سه ر ئایه تی دووه م كه خوایي گه وره بهالظَّالِمُونَ ناوی بردوون بابزانین له شوینه كانی تر خوایي گه ورهالظَّالِمُونَ بۆ چ كه سیكش یان بۆ چ كۆمه له یكی به كار هیناوه

**یه كه م خوای گه وره له سوره تی ئه نعام ده فه رموویت :**

﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُولَـٰئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾

واتە: ئەو كەسانەی بڕوایان هێناو، لەهەمان كاتدا ناحەقیی و شیركیان تێكەڵ بە ئیمانەكەیان نەكردئاسایش و نەبوونی ترس لەسزای خوا هەربۆ ئەوانە، نەك بۆ بت

پەرستەكان و هەر ئەوانیشن ڕێنمایی كراو بۆ ڕێگەی ڕاست و، بەهەقیانەتیش لەسەرینی.
پێشەوا(ئەحمەد) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، هاوەڵان زۆرپێیان سەخڵەت بوو و گوتیان: ئاخۆ كەسێك هەبێ ستەمی نەكردبێ لەخۆی ؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: مەبەست بەو (ستەم)ە لە ئایەتەكەدایە (شیرك)ە، واتە: دانانی شەریكە بۆ خوا، مەگەر ئەو ئایەتانەتان نەخوێندۆتەوە كە (لوقمان) بە كوڕەكەی خۆیگوت: (يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ).

وه خوايي گه وره له سوره تی ئه نفال ئایه تی٥٤ده فه رموویت

﴿ كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا ظَالِمِينَ ﴾

واتە ئەوانە بەدەردی داروودەستەكەی فیرعەون و، ئەوانەی لە پێشیانەوە بوون ( هوود و لوط ..)چوون چونكە باوەڕیان بە ئایەتەكانی پەروەردگاریان نەكردئینجا ئێمەیش بە هۆی گوناهەكانیانەوە لەناومان بردن هەرچی سەربە فیرعەونیش بوون لەدەریادا خنكانمان و نقوممان كردن كە هەموویان ستەمكار بوون

سه يری ئه م ئايته بكه خوايي گه وره فيرعه ونی به چ ناوبرد كه فيرعه ون ده يوت من خوام به ظَالِمِينَ

وه خوايي گه وره له سوره تی البقرة ئايه تی ٢٥٤ده فه رموويت

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ببەخشن هەندێك لەو ماڵ و سامانەی پێمانداون پێش لە هاتنی ڕۆژێك هیچ كڕین و فرۆشتنێكی تیدا نییە (تا بەماڵ خۆتان بكڕنەوە)

هەروەك هیچ دۆستیی و تکاو شەفاعەتێك سوودی نابێ. ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: دۆستایەتی تەنها لە نێوان بێ بڕواکاندا سوودی نیەو بێ کەڵکە، تکاش هەر بۆ بێ بڕوایان نیە، ئەگینە-ئەگەر خوا خۆی بیەوێ و مۆڵەت بدات- بۆ موسڵمانان شەفاعەت هەیە،هەرکافروبێباوەڕان ناهەقیکارو ستەمکارن،

وە خوایی گە ورە لە سورە ی ئە عراف ئایە ی٤٧ دە فە رموویت: ﴿ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ النَّارِ قَالُوا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾

واتە وکاتێکیش چاویان لەبەهەشتیەکان وەردەگێڕدرێ(ئە وانە ی لە بە ینی دۆزە خ و بە هە شت ماون) بەرەو ڕووی دۆزەخیەکان دەڕوانن و بەو حاڵە زۆر خراپەیانەوە دەیانبینن دەڵێن: پەروەردگارمان ! تکات لێ دەکەین مەمانخە ریزی ئەوانەوەستەمیانکردووە.

(کین ستە میان کردووە ئە وانە ی لە دۆزە خن)

هە مان سورە ت ئایە ی ١٤٨ ﴿ وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِن بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ ﴾

واتە: پاش چوونەکەی موسا بۆ کێوی (توور) گەلەکەی- لەخشڵ و زێڕەکەیان - گوێرەکەیەکی بە بۆڕەیان بۆخۆیان سازدا وپەرستیان ! پیاوێکی(سامریی)ناویان هەڵسا بە ئەنجامدانی ئەو کارەو سەرپەرشتی کرد، دەرئجام ئەو گوێرەکە بێ گیانەی لە شێوەی پەیکەردا لێکەوتەوەو پەرستیان ! مەگەر نەیاندی ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵ ناکات و بۆ ڕێی ڕاستیش ڕێنماییان ناکات لەگەڵ ئەوەیشدا کردیانە خوای خۆیان!! وە بەرامبەر بە خۆیان ستەمکاربوون و چوونە ریزی موشریکانەوە

سه یركه قه ومه كه ی هه ستاون به په رستنی بتیك كه له زێر درووستكراوه له هه مانكاتیشدا خوايي گه وره فه رمووی وَكَانُوا ظَالِمِينَ.

وه خوايي گه وره له سوره تی یونس علیه السلام ئایه تی١٣ ده فه رموويت:

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴾

واته: به ڕاستی چینێكی زۆرمان بەرلە ئێوە -كاتێ ستەمیانكردو بێ باوەڕ بوون-لەناوبرد خۆ پەیامبەرەكانیشیان بە چەند نیشانەو بەڵگەی روونەوە بۆهاتبوو، بۆ ئەوەی باوەڕ بێنن وهەر باوەڕیان نەهێنا، واتە: بۆ خۆشمان دەمانزانی كە هەر خۆبەدەستەوە نادەن و، پێ لەسەر شیرك وكوفری خۆیان دادەگرن، ئەگەر پێغەمبەرانیش بێنە لایان، بۆیە فەوتاندمان ئێمە هەر ئاوا سزای تاوانباران دەدەین ، پاش بەڵگەو تێگەیاندنیان.

ئه وانه كێ بوو كه سته ميانكرد ئه وانه بوون كه باوه ريان به به لگه كانی خوايي گه وره نه بوو ياعنی كافر بوون له كه ل ئه مه ش خوايي گه وره پێ ی فه رموون ظَلَمُوا

له هه مان سوره ت ئايه تی ٩٣ خوايي گه وره ده فه رموويت:

﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴾

واتە: نەخێر، كە باوەڕیش ناهێنن هی ناتەواوی قورئان نیە بەڵكو بەدرۆی دەزانن و لە ماناو مەبەستەكانی تێنەگەیشتوون وهێشتا ڕاستییشیان بۆ دەر نەكەوتووە، واتە: ئەنجامی هەڕەشەكانی قورئانیان بۆ پێش نەهاتووە، هەق بوو چاوەڕوابن و پەلەنەكەن،هەرئاوا

ئەوانەش لە پێشیانەوەبوون ، باوەڕیان بەهەرەشەكانی خوا نەكردو، پێغەمبەرەكانیان بەدرۆزن دانا سا بروانەو چاك بزانە ئەنجامی ستەمكارانی گەلانی پێشوو چۆن بوو؟

هه مان سوره ت ئایه تی ٥٢خوایێ گه وره ده فه رموويت :

﴿ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾

واته له پاشان بەو كەسانەكە ستەمیان كردووە دەگوترێت دەسا سزای هەتا هەتایی بچێژن ئاخۆ بەدەر لەوە خۆتان كردووتانە، جەزرەبەو تۆڵە دەدرێن ؟دڵنیابن چیتان كردووە، هەر بەوەش تۆڵە دەدرێن .

هه مان سوره تی یونس علیه السلام ئایه تی ٥٤ خوایێ گه وره ده فه رموويت: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾

واته : ئه گه ر هەرچی له زەوییدایه هی تەنها كەسێكی ستەمكار بێت لەرۆژی قیامەتدا بریتی خۆی پێ دەدات بۆ ڕزگار بوونی له سزا وه ئەوكاتە كەبەچاو سزاكە دەبینن، له نێوانیاندا بەدادگەرانە داوەریی دەكرێ و هیچ ستەمیشیان لێ ناكرێ

هه مان سوره ت ئایه تی ٨٣-٨٤-٨٥-٨٦ خوایێ گه وره ده فه رموويت: ﴿ فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ ﴾٨٣

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴾ ٨٤

﴿ فَقَالُوا عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾٨٥

﴿ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾ ٨٦

واتە جا لەسەرەتاوە چەند تازە لاوێكی هۆزەكەی نەبێ بڕوایان بەمووسا نەهێنا لەترسی فیرعەون و پیاوەگەورەكانیان كە سزایان بدەن و لەو ئایینە بەزۆر وەریان گێڕن بێگومان فیرعەون لەو وڵاتەدا پیاوێكی خۆ بەزلزان و دەسەڵاتدارو و یەكێ بوو لەسنوور دەرچووان و سەرلێشێواوان ، بۆیە داوای خوایەتی دەكرد!.٨٣

موسا وتی: ئەی گەلەكەم ئەگەر بەڕاستی ئێوە باوەڕتان بەخوا هێناوە جا دەبێ تەنها پشت بەو ببەستن ئەگەر موسڵمان و ملكەچی فەرمانی ئەوبوون٨٤

جائەوانیش وتیان: ئێمە تەنها بەخوا پشت ئەستوورین و، كاری خۆمان دایە لای ئەو ئەی پەروەردگاری ئێمە! مەمانخەرە بەرفیتنەو تاقیكردنەوە لەبەر دەستی هۆزو گەلی ستەمكاراندا ،تا زاڵ نەبن بەسەرمانداو، لەدین وەرمان نەگێڕن٨٥

و بە میهرەبانی خۆیشت لەدەست هۆزی بێ بڕوایان-فیرعەون وتاقمەكەی ئەو- رزگارمان بكە٨٦

(فیرعە ون ودە ستە كە ی كافرو بێ بروابوون بە لام كاتیك ئە وا نە ی لە گە ل موسا علیه السلام دا بوون دوعادە كە ن دە لین رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ بۆ دوایش دە لین وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ).

هه مان سوره تی یونس علیه السلام ئایه تی ١٠٦ خوایی گه وره ده فه رموویت: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ ﴾

واته ونابێ جگه لەخوا، شتێ وا بپەرستی كه: نه سوودت پێ بگەیەنێت نەزیانت لێبدا جائەگەر كاری واتكرد،واته: هاوارت بۆ غەیری خوا برد، بێگومان تۆ له ستەمكارانی

وه خوایی گه وره له سوره تی هوود علیه السلام ئایه تی ١٨ده فه رموویت: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أُولَٰئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾

واته: دەبێ كێ لەوكەسەستەمكار تربێت كه: لەسەرخوا درۆ هەڵبەسێ و هاوبەشی بۆ بڕیار بدات ؟ گشت ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا لە خزمەتی پەروەردگاریاندا ڕادەنوێترێن بۆ پرسیارو وەڵام و شایەتگەلێكی زۆر ( لە ئیمانداران و فریشتەو پەیامبەران) لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و شایەتیان لەسەر دەدەن و ئەڵێن: ئەمانە بوون - لە دونیادا- لەسەر پەروەردگاریان درۆیان كردو، هاوڕێ و هاوەڵیان بۆدانا دەبا نەحلەت و نەفرینی خوا لەخەڵكانی ناهەقكارو ستەمكار بێت

هه مان سوره ت ئایه تی٣٧خوایی گه وره ده فه رموویت: ﴿ وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴾

واته: دەبێ لەبەرچاو خۆمانەوەو بەپێی سروش و فەرمانی خۆمان كەشتیەك دروست بكەیت و خەڵكە موسڵمانەكەی سوار بكەیت و ئیتر لەمەڕ ئەوانەوە ستەمیانكردووە لێم مەپاڕێوە" بۆ ڕزگاربوون و لەناو نەچوونیان "چونكە بەراستی بڕیار دراوە كە دەبێ ئەوانە نقوم ببن وبخنكێن ،واته: كار لەكار ترازاوەو قسەی پێناوێ (مه به ستی ئه م كه سانه یه كه باوه ریان به نوح (علیه السلام) نه كردو كافربوون)

هه مان سوره ت ئایه تی ٤٤ خوایي گه وره ده فه رموويت: ﴿ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾

واتە: و دوای تیاچوونی گەلە لاسارەکەی نووح لەلایەن خواوە، وترا: ئەی زەویي! ئادەی ئاوەکەی سەرت هەڵ لووشەو بیکەوە ناو زکی خۆتەوە تۆیش ئەی ئاسمان! دەست بەرداریە لەئاو ڕژاندن و، باران مەبارێنە خێرا ئاوەکە کەم بوویەوەو دادەڵییە ناو ناخی زەویي و، بڕیارو و فەرمانەکەی خواش بەتیاچوونی گەلەکەی نووح جێبەجێ کرا و کەشتییەکەش لەسەر کێوی جودیي وەستاو لەنگەری گرت.پاشان گوترا: دەبا ئەو گەلە ستەمکارەیە لە بەزیي خواوە دووربێ

هه مان سوره تی هوود عليه السلام ئايه تی٦٧ -٦٨خوايي گه وره ده فه رموويت

﴿وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾٦٧

﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَا أَلَا إِنَّ ثَمُودَ كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴾٦٨

واتە: وە بۆ ڕۆژی چوارەم- ئەوانەیان ستەمیانکردبوو- (قه ومه كه ی (گەلی سەموود) پيغه مبه ر صالح عليه السلام كه باوه ريان پیٔ نه كردوو كافربوون )نەعرەتەو دەنگێکی بەهەیبەت (بومەلەرزە، شریخەو بروسکە) گرتنی، لەئەنجامی ئەوەدا شارەکەیان ژێرەو ژوور بوو ئیتر هەموو لەخانوو و شوێنەکانی خۆیاندا دەمەو ڕوو کەوتن و مردن٦٧

واته دەتگوت لەو وڵاتەدا ڕۆژێ نەژیاون و نەبوون بزانن کە بێگومان هۆزەکەی (سەموود) بێ باوەڕ بوون بەپەروەردگاریان، بۆیە ئەویش وای بەسەرهێنان بێدارین ! بڕیاری دووریي بۆگەلی سەموود لە بەزەیي خوا درا.٦٨

هه مان سوره تی هوود علیه السلام ئایه تی ۸۳خوایي گه وره ده فه رموويت: ﴿ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾

واته بەردەكانیش هەریەكە لای پەروەردگارت ناوونیشانی ئەوكەسەی بۆ دیاری كراو بوو، لێی بدات خۆ ئەو ناوچەو وڵاتە وێرانكراوە لەستەمكارانی قورەیشەوە دوور نییە ، بۆعیبرەت وەرگرتن، بەڵكو زۆر جارانیش بەلایا تێدەپەڕن، واچاكە بۆیان عیبرەتی لێ وەرگرن. یان دەڵێین: بەڵاو بەسەرهاتی ئاواسەبارەت بەستەمكاران هیچ دوور نییە، واتە: گشت ستەمكارێكی لەوچەشنە بەڵای ئاوای پڕ بە باڵایە (ئه وكاته ى خوايي گه وره قه ومى لووتى به ردباران كرد)

هه رله سوره تی هوود علیه السلام ئایه تی ٩٤ خوايي گه وره ده فه رموويت﴿ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴾

واتە: و كاتێ كەفەرمانی ئێمە هات بۆ سزادانیان بەبەزەیی و دلۆڤانی خۆمان ، شوعەیب و ئەوانەی بڕوایان پێ هێنابوو ڕزگارمان كردن و تاوانبارو ستەمكارەكانیشمان بەدەنگ وشریخەیە مەزن گرت و ئینجا لەشوێنەكانی خۆیاندا هەموو دەمەو ڕوو كەوتن و مردن

هه مان سوره ت ئایه تی ۱۰۱-۱۰۲خوايي گه وره ده فه رموويت:

﴿ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ لَّمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴾۱۰۱

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ ١٠٢

واته خۆ ستەمیشیان لێنەکردن لەو تیاچوونەدا بەڵکو ئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد،بەکوفرو نافەرمانیکردن ئینجاکەبڕیارو فەرمانی پەروەردگارت بۆ تیاچونیان هات، ئیتر ئەوگشت بتانە کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن فریایان نەکەوتن و، نەیانتوانی هیچێك لەسزا بێ نیازیان کەن و تیاچوون و ماڵ وێرانی نەبێ، شتێکیان بۆ زیاد نەکردن ١٠١

سزاو قاری پەروەردگارت ئاوایە کاتێ ویستی خەڵکانی ستەمکاری شارو گوند نشینەکان لەناوبەرێت کەبەڕاستی سزاو قارێکی سەخت و ئێش پێکەیەنەر بوو١٠٢

هە مان سورە ت ئایە تی ١١٣خوایی گە ورە دە فە رموويت:

﴿وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾

واتە: بەهیچ شێوەیەك مەیل مەکەن بۆلای ئەوانەی ستەمیان کردووە، واتە: پاڵیان پێوەمەدەن و پشتگیریان لێ مەکەن و، بەکردەوەیان رازیی مەبن دەنا ئاگر ئەوقەتان ئەبێ و دەسووتێن و بێجگە لەخواش هیچ یارمەتی دەرێکتان بۆ نابێ لەوئاگرە دەرتان بێنێ پاشانیش سەرناخرێن بەسەر دوژمندا.

شێخی (بەیزاویی) لەمانای (رکون)دا دەڵێت: ( هو المیل الیسیر. أی لا تمیلوا إلیهم أدنی میل فتمسکم النار برکونکم إلیهم، وإذا کان الرکون الیسیر إلی من وجد منه میل ما یسمی ظلما کذلك، فما ظنك بالرکون إلی الظالمین الموصوفین بالظلم، والمیل إلیهم کل المیل ) واتە: (رکون) بەکەمترین مەیل و پاڵ پێوەدان دەڵێن، جا ئەگەر مرۆڤ بەکەمترین مەیلدان بەلای موشریکان و زاڵمانەوە، بسووتێ و گیرۆدە ببێت، دەبێ حاڵی زاڵمان خۆیان و ئەوانەی وا بەتەواوی هاوکارییان دەکەن چۆن بێ؟( قەتادە ) ئەڵێ: مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە کەناهەقکاران و ستەمکارانتان خۆش نەوێ و، بەقسەشیان مەکەن. کەوابوو

چەندە بتوانرێ دەبێ ئەوەندە هاوڕێی و هاوکاری خەڵکی کافرو بیدعەچی نەکرێ. خۆ ئەگەر ناچار کراین هاکاریی و هاوڕییەتییان بکەین، ئەوە دەچێتە بابی (توقیە) و ناچارییەوەو ئەمیش کۆمەڵێ مەرجی هەیە،

خوایی گە ورە لە سورە تی (ئیبراهیم علیه السلام ) ئایە تی ١٣ دە فە رموویت:

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ ﴾

واتە: وە ئەوانەی کە کافرو بێ باوەڕبوون بەپەیامبەرەکانی خۆیانیان گوت: ئەمە سوێندی بێت لەم وڵات و سەر زەوییەماندا دەرتان دەکەین یان دەبێ واز لەودینە بێنن و، بگەڕێنەوە بۆ دین و بیروباوەڕی ئێمە ، دیارە ئەم هەڕەشەو گوشارە ، دابی هەموو خوا نەناس و کافرێکە، بۆیە هۆزەکەی (شوعەیب)یش (علیە السلام)- بەشوعەیبیان گوت: ( لنخرجنك ياشعيب والذين أمنوا معك من قريتنا ..) ٧/٨٨. وەیان هۆزەکەی لووت علیه السلام دەڵێ: ( أخرجوا آل لوط من قريتكم ). ئینجا پاش ئەوە پەروەردگاریان وەحی بۆ کردن و تێیگەیاندن کە بەراستی دەستەو بەستەی ناهەقیکاران و ستەمکاران لەناودەبەین

وە لە هە مان سورە ت ئایە تی ٤٤ خوایی گە ورە دە فە رموویت:﴿ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴾

واتە: ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەو خەڵکە لەسەختی و نارەحەتی ڕۆژێك بترسێنە کە سزاو جەزرەبەی خوایان بۆ دێت جا ئەوانەی ستەمیانکردووە،کاتێ سزاکەدەبینن دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! بۆماوەیەکی کەمیش بێت مۆڵەتمان بدەو ئاکامان دواىخە تاوەلامی بانگەوازەکەت بدەینەوە و شوێنی پەیامبەران کەوین،: ئەوجا پێیان

ئەوتریٰ: ئەی بۆ ئێوە نەبوون لەپێشەوە سوێندتان خوارد؟ کە هەرگیز کە دنیا بەردەوامەو ئێوە تیاچونتان بۆ نیەو، قیامەتیش نایەت، دەسا وابوو؟

وه خوایي گه وره له سوره تی حیجر ده فه رموويت :

﴿ وَإِن كَانَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ لَظَالِمِينَ ﴾

واته: بەڕاستيي (أصحاب الأيكة) خاوەن بێشەكان، واتە: گەلەكەی (شوعەیب) بڕوایان بەشوعەیب نەهێناو ستەمكاربوون و لەسەر ناهەق بوون.( ئەیكە/ بەجێگایەكی پڕ لەدار و درەخت دەڵێن)

وه خوایي گه وره له سوره تی نحل ئایه تی٨٥ده فه رموويت﴿ وَإِذَا رَأَى الَّذِينَ ظَلَمُوا الْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾

واته: كاتێ كە ستەمكارەكان جەزرەبەو سزای دۆزەخ دەبین ئیتر نەسزایان لیٰ كەم دەكرێتەوەو، نە مۆڵەتیش دەدرێن بۆ كاتێكی تر، بەڵكو بەپەلە دەیانفڕێنن بۆناو ئاگر، چونكە ئاكامیان ئاشكرایە.

هه مان سوره ت ئایه تی ١١٣ خوايي گه وره ده فه رموويت:

﴿ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴾

واته: بێگومان هەر لەخۆیان پەیامبەرێك هاتەلایان، كەچی بڕوایان پیٰ نەكردو بەدرۆیان خستەوەو ڕووبەڕوی وەستان ئینجا هێندە ستەمكاربوون سزا گشتیانی گرتەوە

(باوه ر نه كردن به پيغه مبه ريك خوايي گه وره به ظَالِمُونَ وه سفى كردوون ).

وه خوايي گه وره له سوره ى ئيسراء ئايه تى ٩٩ده فه رموويت:

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى الظَّالِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴾

واته: ئاخۆ نابینن و تێ نافیكرێن كه هەر ئەو خوایەی ئاسمانەكان و زەویی دروستكردووه.. هەرئەویش بەتوانایەو دەسەڵاتی هەیه بۆ جارێكی تر دروستیان بكاتەوه، خۆ بۆ یەكەمجار بێناغه و بێبنەمایەك بەدیهێناون، دڵنیابن ئێستا زۆر بەئاسانتر دەتوانێ دروستیان بكاتەوه،دیاره كه بۆ زیندوو بوونەوەو گەڕانەوەیان بۆلای خۆمان، ڕۆژو ماوەیەكی تایبەتیمان بۆ دیاریكردوون و، هیچ گومانێكیش لەهاتنی ئەو ڕۆژەدا نییەو، بەڕێك و پێكی هەموویشیان لەوكاتەدا زیندوو دەكرێنەوه،كەچی ستەمكاران هەر بڕیاری یاخی بوون و سەركەشی و كوفریانداوەو هیچی تر.

وه خوايي گه وره له سور ى ئه نبيا ئايه تى٢٩ ده فه رموويت :

﴿ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴾

واته: هەركەسێك بڵێ: منیش خوایەكم جگە لەو، ئەوە پاداشتی بە دۆزەخ ئەدەینەوە هەر ئاوایش تۆڵە و پاداشتی یاخییان و ستەمكاران ئەدەینەوه

وه هه مان سوره ت ئايه تى ٦٤خوايي گه وره ده فه رموويت ئه م كاته ى (ئيبراهيم عليه السلام) بته كانى شكاندبوو﴿ فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ ﴾

واته: جا ئیتر كەمێك داچڵەكان و چوونەوە بە خۆیاندا و ئیعادە نەزەریان كرد. دەرەنجام وتیان بەخۆیان: ئێوە هەر خۆتانن ستەمكار، نەك ئیبراهیم، ئەگینا شتێ قسە نەكاو، دەسەڵاتی نەبێ بەرگری لە خۆی بكا، ئەوشتە چۆن ئەبێ بە خوا؟!

(ئێ باشه خۆ ئه مانه بت په رست بوون ده كريت بلێین ئه گه ر باوه ريان پێ ی نه بیت ئه وه پێ ی كافر نابن و ته ئویلیكی ساردو سڕی بۆ بینینه وه ؟)

هه مان سوره ت ئايه تی ٩٧خوايي گه وره ده فه رموويت :

﴿ وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ ﴾

واتە: ئەوسا ئیتر بەڵێنە ڕاست و دروستەكەش "بۆ هاتنی قیامەت" نزیك دەبێتەوە، واتە: هەر یاجوج و ماجوج لەو جێگای خۆیانە هاتنە دەرێ، ئەوە ئیتر قیامەتیش نزیكە ئەوسا ئیتر چاوی ئەو كەسانەی خوانەناس و بێ بڕوان ئەبلەق ئەبێ و، لەجێی خۆی ناجووڵێ، واتە: لەبەر نارەحەتی ئەو ڕۆژە چاویان بۆ ناتروكێ هاواریان لێ بەرز ئەبێتەوە و ئەڵێن: ئەی تیاچووە خۆمان! بەڕاستی ئێمە لە غەفڵەت و بێئاگاییدا بووین لەم ڕۆژە نەك هەر غافڵ بووین، بەڵكو ستەمكاریش بووین لە خۆمان

وه خوايي گه وره له سوره تی الفورقان ده فه رموويت:

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا﴾

واتە: وە ئەو كافرو بێباوەڕانە دەربارەی قورئان گوتیان: إ ئەم قورئانە هەر درۆیەو، موحەممەد (صلی الله علیه و سلم) خۆی هەڵیبەستووە و كەسانی تریش -وەك خاوەن نامەكان- بۆ هۆنینەوەو ڕێكخستنی یارمەتییان داوە ئینجا خوا ڕەدیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ: بەڕاستی هەرچییەكیان گوت، بوختانەو ستەمێكی گەورەش دەكەن،

وە لە سورە تی النمل ئایە تی ٤٤ خوایي گە ورە دە فە رموویت

﴿ قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾

واتە پێی وترا: وەرە نێوکۆشکەوە جا کە مەلیکە لێی روانی پێی وابوو ئاوێکی زۆرو زەبەندە، کە ئەگەر بەسەریا بروا لاقی تەڕئەبێت بۆیە هەردوولاقی خۆی هەڵکرد ( وپاوو پووزی دەرکەوت) تا لە ئاوەکە بپەڕێتەوەو لاقی تەڕنەبێ سولەیمان بەبەڵقیسی وت: بەراستی ئەوپانتایي کۆشکە تۆدەبینیت شووشە بەندەو ئاونیە، واتە:پێویست ناکات لاقت هەڵبکەیت بەڵقیسیش کە ئەوکۆشك وتەلارو دەسەڵاتەی چاوپێکەوت وتی: ئەی پەروەردگاری من ! بێگومان من تائێستا ستەمم لەخۆم کردووە" (کە خۆر پەرستبوو هە روە کو ئە م کاتە ی پە یووە کە گە رایە وە لایي سولە یمان علیه السلام وتی وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ واتە لەڕووی بیروباوەڕیشەوە دیتم کە خۆیي و گەلەکەی لەباتی خوا کڕنووش بۆخۆر دەبەن ) وەلە ئیستاوە لەگەڵ سولەیماندا ملکەچ و تەسلیمي خوای پەروەردگاری جیهانەکان بووم

وە خوایي گە ورە لە سورە تی غافر ئایە تی ٥٢ دە فە رموویت :

﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ ﴾

واتە: ئەو رۆژە کە برو بیانوو پاڕانەوەی ستەمکاران وەر ناگیرێ و، هیچ کەڵکێکیان پێ ناگەیەنێ نەفرەت و خراپترین حاڵ و جێگەیان بۆ هەیە لە دۆزەخدا

وە زۆر روونتر دینین و کۆتایي پيئ دێنین ان شاءالله خوایي گە ورە لە سورە تی الشوری ئایە تی٢١دە فە رموویت :

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾

واتە: ئاخۆ ئەوانە ڕێگەی خواناسین دەگرن، یا خۆ چەند هاوبەشێك بۆ خوا دادەنێن چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن لە ئایین کە بەهیچ شێوەیە خوا مۆڵەتی نەدابن، خۆ شتی وا نەبووە ؟! ئەگەر بەڵێنی خوا نەبا بە دوا خستنی سزا بۆ ڕۆژی قیامەت هەر زوو لەدونیادا بڕیار درابوو لە نێوان ئەوان و ئیماندارەکاندا و بێگومان بۆ ستەمکاران جەزرەبەو سزایەکی بە ئێش هەیە.

لیره دا کۆتایي پێ دینین که ئه مه ی نووسیومه ته واوی به ڵگه کان نین هیشتا له سه رووشه ی (ظلم) به ده یان ئایه تی تر له م شیوه یه ماوه به لام له به ردریژنه بوونه وه ی بابه ته که هه ر ئه وه نده داده نیم وه که سیکیش حه ق ویست بیت ان شاءالله ئه وه نده به ڵگه به سه بۆی وه که سی حه ق نه ویست  به هه زاران به ڵگه ی پیۓ بلێیت هه ر یه ك و دووت بۆ ده کات جا  ان شاءالله دێینه سه ر وشه ی (الفسق) بابزانین خوايي گه وره بۆ چ که سیك یان بۆ چ کۆمه له یکشی به کار هیناوه .

**ئایه تی سێ یه م وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ**

خوايي گه وره له سوره تی البقرة ئایه تی ٩٩ ده فه رموويت:

﴿ وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ ﴾

واتە: سوێند بێ بەخوا ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئێمە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆرو ئاشکرامان بۆناردویت، بۆ سەلماندنی ڕاستیی پەیامبەرێتیت خۆمەگەر هەر فاسق ولەسنووردەرچووەکان حاشاو نکووڵی لێ بکەن پیۓ ی کافرین

وە خوایی گە ورە لە سورە تی نوور ئایە تی ٥٥ دە فە رموویت:

﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴾

واتە: بێگومان خوا بەو کەسانەتان کە بڕوایان هێناوەو کارە چاك و جوانەکانیان ئەنجامداوە، بەڵێنی دا: لەم زەمینەدا بییانکا بە جێنشین و، کلیلی دەسەڵاتداری دونیایان تەسلیم بکا ، واتە: بیانکات بە خەلیفەی رووی زەویی هەروەك چۆن موسڵمانانی پێش ئەوانی کردە جێنشین. ئەودین و ئایینەش خوا خۆی بۆی پەسەند کردوون، ریشەدارو سەقامگیر و سابت و دامەزراو دەکا بۆیان وە ترس و بیمەکەشیان بۆ دەگۆرێ بە ئارامیو ئاسوودەیی ئیتر ئەو کاتە تەنها من بپەرستن و هیچ شتێکش نەکەنە هاوبەشم ئەوسا هەرکەسێکیش - پاش ئەوە-کافر بوو، واتە: پاش هاتنە دی بەڵێنەکە ئائەوانەن فاسیق و دەرچوو لە سنووری شەرع

وە خوایی گە ورە لە سورە تی ئە حقاف ئایە تی ٣٥ دە فە رموویت: ﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ بَلَاغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ ﴾

واتە: پاش ئەوەی خوا بە یەکزانین و زیندوو بوونەوەی بە بەڵگەو نیشانەوە سەلماند ، ئەفەرمووێ: جا ئارامت بێ و خۆڕاگربە ئەی موحەممەد! (صلی اللە علیە و سلم) هەروەکو پەیامبەرە خاوەن (عەزم)ـەکان خۆیانیان ڕاگرت لەبەردەم ئەو هەموو ئەزیەت و ئەشکەنجەیەدا.

ئولولعەزم ئەمانەن: (نووح، ئیبراهیم، موسا، عیسا) - علیهم الصلاة والسلام و بۆ ئازارو سزادانیان پەلە مەکە و نزای شەڕیان لێ مەکە، چونکە ئەو سزایەیان هەر ئەوقە ئەبێت ئەو ڕۆژە کە بەڵێنیان دراوەتێ، هەر کاتێك پێشهات، وا دەزانن تەنها کاتێکی زۆر کەمیان

لەرۆژێکدا پێچووە، ئەم قورئانە ڕاگەیاندنێکی تەواوە بۆیان جا ئایا جگە لەگەلی لە سنوور دەرچووان، کەسێکی تر بەسزا تیا ئەچێ ؟! دیارە نا، کە ئەمەش ئەوپەڕی دادگەری و دادپەروەری خوای گەورەیە.

وە لە سورە تی البقرة ئایە تی ٥٩ خوایێ گە ورە دە فە رموویت:

﴿ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾

واتە: کەچی ستەمکارو لەسنوور دەرچووەکان هەڵسان، ئەو وشەو گوتارەی پێیان وترابوو گۆڕییان ولە باتی سوژدەو ملکەچی کەوتنە گاڵتە و لەباتی ئەوەی بڵێن ( حطة ) وتیان ( حَبَّة ). ئینجا لەبەر ئەوەکە نافەرمانیان کرد(واتە فاسیق بوون مە بە ستی جولە کە یە نە علە تی خوایان لێ بدات ) ئێمەش لە ئاسمانەوە سزایەکمان ناردە سەریان.

وە لە سورە تی المائيدە ئایە تی ٢٤ خوایێ گە ورە دە فە رموویت: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَا أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي فَافْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴾

واتە: ئەوجا مووسا وتی: پەروەردگارم! خۆت دەزانی کە بەڕاستیی من تەنها دەسەڵاتی خۆم و براکەم هەیە، ئێمە دەرەقەتی ئەوان نایەین دەسا تۆ ئێمە لەو گەلە ستەمکارو لەسنوور دەرچووە لێکجیا بکەوەو هەمووکەسێکیش بەتۆڵەو پاداشی خۆی بگەیەنە (ئە م کاتە ی مووسا علیە السلام دوعا لە جوولە کە کان دە کات کە زۆر بە بێ ئە دە بی وتیان موسا تۆ و پەروەردگارت،نە یان وت پە روە ردیگارمان بچن جەنگیان لەگەڵ بکەن، ئێمە وا لێرە دانیشتووین و نایەینە جەنگ،)

وه له سوره تى ئه نعام ئايه تى ٤٩ خوايى گه وره ده فه رموويت: ﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا يَمَسُّهُمُ الْعَذَابُ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾

واته: ئەو كەسانەش كە بەڵگەو نيشانەكانى ئێمە بەدرۆ دادەنێن و، بەدواى پێغەمبەراندا ناچن بەهۆى لەسنوور دەرچونيانەوە سزايان ئەوقە دەبێ.

وه خوايى گه وره له سوره تى ئه عراف ئايه تى ١٤٥ ده فه رموويت: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا بِأَحْسَنِهَا سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ ﴾

واته: وه لەو(لەوح)و تەتەڵانە، بەموسامان دان، حوكمی هەموو شتێكمان بۆ نووسيی، واته: ئەوەى ئەوان پێويستيان پێبوو بۆمان نارد. (ئەلواح) كۆى (لەوح)ـە، مەبەست بەو تەتەڵانەيە بەرنامەو شەريعەتەكەى موساى تێيدا نووسرابوو تا ببێ بەپەند و ئامۆژگاريي بۆيان و شيكەرەوەى هەموو حەڵاڵ و حەرامێك جا تۆش مووسا! زۆر بەهێزو بە توند ئەو(ئەلواح)انە بگرە فەرمان بە گەلەكەشت بدە هەرەچاكەكەيان بگرن و رەفتارى پێ بكەن، مەبەست ئەوەيە كەتەتەڵەكانى تەورات (حسن )و(أحسن )ى تێدايە، بۆنموونە ( قصاص )و تۆڵە وەرگرتنەوە رێى پێدراوەو كارێكى(حسن)ە، عەفەوو لێبوردنيش هەروا، بەڵام كارێكى(أحسن )ە.دەسا ئێوە كار بە(أحسن)ەكەى بكەن. دڵنياشبن خانەو لانەى سنوور بە زێنەكانتان- لە سەفەرەكانتاندا - نيشان دەدەم ، ئەوسادەبينن چيمان پێكردوون.(به راستى ئايه ته كان زۆر روونن بۆيه هيچ رونكردنه وه يكم نه داوه بۆ كه سانى حه ق ويست به س ده بيت)

هه مان سوره تی ئه عراف ئایه تی ١٦٣خوایی گه وره ده فه رموویت: ﴿ وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾

واتە: ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی شارەکەی (ئەیلە)وە کە دەکەوێتە قەراخی - دەریای سووروو ، نێوان مەدیەن و کێوی طوور- لێیان بپرسە: چی بەسەر هات و، هۆی بەسەرهاتەکەی چیبوو؟! کاتێ کە لەڕۆژی شەممەدا نافەرمانی خوایان دەکردو، ماسیەکانیان لەو ڕۆژە قەدەغە کراوەدا ڕاو دەکرد! چونکە لە ڕۆژی شەممەدا ماسییەکان ، بەزۆری لەسەر ئاوەکە دەردەکەوتن و، بەئاسانی "وەك تاقییکردنەوەیەك"بۆیان دەگیردران بەڵام ئەو ڕۆژە کە شەممە نەدەبوو، دیار نەدەمان و" خۆیان دەر نەدەخست ، ئەوانیش لە شەممەدا پشوویان بۆدەگرت و بۆ ڕۆژی یەکشەممە ئەیانگرتن و بەمە سنووریان بەزان ویاخیبوون ئاوا تاقییان ئەکەینەوە- لە تۆڵەی سەرپێچی خۆیاندا- بە هۆی ئەوەی نافەرمانیان کردو لە سنوور دەرچوون . ( أصحاب السبت ) لەڕۆژەکانی هەینیدا دەهاتن حەوزێکیان دروست دەکردو ماسیەکانیان تێدەکردو تێیدا دەمانەوە، ئەوسا تا شەممە بوایە دەستیان بۆ نە ئەبردن، بەڵکو -وەك فێڵێك- دەچوون ڕۆژی یەکشەممە دەریان دەهێنان ئێنجا سە یرکە خوایی گە ورە فە رمووی كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ !!.

هه مان سوره ت ئایه تی ١٦٥ خوایی گه وره ده فه رموویت:

﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾

واتە: جا کە ئەو پەند و ئامۆژگارییەیان لە بیرخۆبردەوە و هیچ سوودێکی پێ نە گەیاندن ا ئێمەیش ئەوانەیانمان ڕزگارکرد کە ڕێیان لەخراپە دەگرت زۆر بەتوندی سزای ئەوانەشماندا ستەمیان لە خۆ کردو، سنوورەکانیان بەزاند

(هه رله هه مان سوره ت ئایه تی دوای ئه مه که ١٦٦خوايێ گه وره سزاكه يان دياری ده كات و ده فه رموويت فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ كه بوونه مه يموون )

وه خوايێ گه وره له سوره تی ته وبه ئايه تی ٨٤ده فه رموويت:

﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ ﴾

واتە: هەرگیز نوێژ لەسەر کەسێ لەو دوو ڕووانە مەکە بمرێ ، چونکە نزاو نوێژی تۆ بۆ ئەوانە، دەبێتە مایەی میهرەبانیی و بارانی بەزەیی خوا، دیارە ئەوانەیش شیاوی ئەو دلۆڤانیی و میهرەبانیە نین گۆڕەکەیشی بە پێوە مەوەستە بۆ داوای گوناح پۆشین و لێبوردن چونکە بەراستی ئەوانە "بەرلەوە بمرن" کافربوون بە خواو بە پەیامبەرەکەی هەر بەفاسقیی و یاخیانەش مردن ، واتە: ئەو خوا نەسانە لەناو کۆمەڵگەدا نابێ پلەو ڕێزیان بۆ دابنرێ.

وه خوايێ گه وره له سوره تی يونس عليه السلام ئايه تی ٣٣ ده فه رموويت:﴿ ذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾

واتە: ئابەو جۆرەیە بڕیاری پەروەردگارت لەبەرامبەر ئەو لەسنوور دەرچووانەوە وەڕاست گەڕا کە بێگومان ئەوانە باوەڕناکەن و ئیمان ناهێنن

وه به لگه يه كی روونتر له سوره تی الكهف ئايه تی ٥٠ خوايێ گه وره ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا ﴾

واتە: ئەو ڕۆژگارە وەبیر بێنە کە بەفریشتەکانمان گوت: سوژدە بۆ ئادەم بەرن، دیارە کەمەبەست لەو سوژدەیە، سوژدەو کڕنوشی ڕێزە، نەك سوژدەی پەرستن ئەوانیش هەموو دەست بەجێ فەرمانەکەیان پیادە کردو کڕنووشیان برد، (ئیبلیس) نەبێ ، ئەو لە(جن) بوو لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوو ئایا ئیتر ئێوە شەیتان و زارۆو نەوەکانی لەباتی من (خوا) دەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان..؟ کەسێك ئەوهەمووکارە ناپەسەندانەی لێ وەشابێتەوە، ئێستاچۆن دەکرێ بەپشتیوان لەحاڵێکا کە ئەوان (خۆی و نەوەی) دوژمنی ئێوەن و، هەمیشە دژایەتیتان دەکەن ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە گوێ ڕایەڵی کردنی ناهەقیکاران بۆ شەتیان لەباتی خوا !

(دە وە رن تە ئویلیکیش بۆ ئە مە بکە ن و بلێن شە یتان کافر نە بووە هە ر ئە مە ماوە)

وە لە سورە تی نە مل ئایە تی ١٢ خوایی گە ورە دە فە رموویت: ﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ فِي تِسْعِ آيَاتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴾

واتە: وە دەستیشت بخە باخەڵتەوەو، پاشان دەریخەوە دەبینی وەکو چۆڕی شیر سپی پاك و بێعەیب دێتە دەرێ و، ڕووناکی دەداتەوە ئەو دوو موعجیزەو بەڵگانە "دەست و، داردەستەکەت" دوو ئایەتن لەو نۆ ئایەتانەی پێت دەبەخشین و ئەبنە بەڵگەت، کاتێ دەچیت بۆلای فیرعەون و گەلەکەی چونکە بەڕاستی ئەوانە گەلێکی یاخیی لەسنوور دەرچوون

وە لە سورە تی السجدە ئایە تی ٢٠ خوایی گە ورە دە فە رموویت: ﴿ وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴾

وه له سوره تی الذاريات ئايه تی ٤٦ خوايي گه وره ده قه رموويت: ﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴾

واتە: بەر لەوانیش هۆزەکەی (نووح)مان- بەتۆفان-لەناوبرد چونکە گەلێکی لەسنوور دەرچووبوون

(ئايه كه سێك هه يه بلّێت قه و مه كه ی نوح عليه السلام كافرنه بوون)

الحمدالله ئه وه ی پيويست بوو به پشتيوانی خوايي گه وره بێ هيچ هيزو قو وه تێكی من ليره دا وتمان و وه ئه وه ی مه به ستيشم بوو ئه وه بوو كه حوكم نه كردن به قورئان كوفره و نابيت جگه له وه ی خوايي گه وره ناردوويه تيه خوا ره وه حوكمی پێ بكريت جا ئه و كه سه بابه زمانيش بليت مسولمانم ئه وه پێ ی كافر ده بێت تۆش ئه ی مسولمان بيربكه ره وه له م رۆژه ی كه ده گه يته وه به ليقائی خوايي گه وره تۆ ده بيت جوابی خۆت بده يته وه و خۆت به ر پرسياری له خۆت نه ك مامۆستا كه ت يان كه سيكی تر جا ژيربه خۆت له خۆت به رپرسياری

وه له دوعايي خير برايي بچوكتان له بيرمه كه ن

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

وصلى اللّه وسلم على نبينا محمد(صلى الله عليه وسلم

٢٠١٦-١٤٣٨

التوحيدى